# حەج و عومرە

## هەنگاو بە هەنگاو





ئامادەکردنی
إحسان برهان الدين

ژمارەی سپاردنی ( 1928)ی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم نامیلکەیەش بەچەشنی نامیلکەی عومرەکە ئاگەداربوومەوە کە سوودی باشی بووە بۆ حاجیان و نوسخەکانیشی تەواو بووە، بۆیە لەسەر داواکاری زۆرێك لە برایان و دڵسۆزان بڕیارماندا بە چاپکردنەوەی بۆ جارێکی تر، بەهیوای ئەوەی خوای گەورە بیکاتە مایەی سوود و لێمان وەربگرێت وەکو کارێکی چاکە کە تەنها بۆ خۆی ئەنجام درابێت.

و الحمد لله رب العالمین

باوکی موحەممەد / إحسان برهان الدين

کەلار 5/10/2010

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی چاپی یەکەم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله و صحبه ومن والاه.

ئەم ناميلكەيە پێشكەشە بە حاجيانی ماڵی خوا، ئەوانەی كەبەڵێنيان وەرگرتووە لەسەر زاری پێغەمبەری خۆشەويستمان موحەممەد (ﷺ) كە ئەگەر حەجەكەيان بەباشی ئەنجام بدەن و، خۆيان بەدوور بگرن لەگوفتارو كرداری نەگونجاو لەگەڵ ئەو ئەركە مەزن و پيرۆزە، وەكو ئەو ڕۆژە دەگەڕێنەوە لەدايك بوونە، جا بەختەوەری بۆ كەسێك ئەو بەڵێنە بيگرێتەوە.

ئەم ناميلكەيە لەبنچينەدا بڵاوكراوەيەكی (دار اطلس الخضراء)ە، لە(رياض) كە بابەتەكانی بەگشتی وەرگيراون لـە دوو كتێبی شێخ (عبدالعزيز بن عبدالله بن باز) و (محمد ناصرالدين الالباني) ڕەحمەتی خوايان لێ بێت، دكتـۆر (عبد العزيز بن محمد السعيـد)يش پيايدا چووەتەوە.

بۆيە منيش بەهيوای پاداشت لـەلای خوای گەورە وەرمگێڕاوەو، هەروەها داوا دەكەم لـەهەر كەسێك لەو حاجيانە دەيخوێننەوەو، دەچنە ئەو شوێنە پيرۆزانە بێ بەشم نەكەن لەنزاو پاڕانەوەيان.

دەپاڕێمەوە لەخوای پەروەردگارئەم ناميلكەيە بكاتە مايەی سوود بـۆ ئەو براو خوشكانەی بەنيازی حەج و عومرەن و، بەكارێكيش وەيبگرێت كەتەنها لەپێناو ڕەزامەندی خۆيدا ئەنجامدراوە.

والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات.

احسان برهان الدين
كلار
١١/ ٩/ ٢٠٠٩
ihsanburhan@yahoo.co.uk

## ڕوكنەكانی حەج

١. ئیحرام (واتە: نیەتی چوونە ناو ئەو خواپەرستنەوە)
٢. ڕاوەستان لەعەرەفە.
٣. تەوافی (الافاضة)*
٤. سەعی نێوان صەفا و مەڕوە.

حەج دروست نییە ئەگەر یەكێك لەو ڕوكنانەی جێ بەجێ نەكرێن

## واجبەكانی حەج

١. ئیحرام كردن لەمیقات و شوێنی دیاریكراوە.
٢. ڕاوەستان لەعەرەفە تاكو خۆرئاوا بۆ كەسێك لەڕۆژدا ڕاوەستا بێت.
٣. مانەوە لەموزدەلیفە شەوی قوربان تاكو پاش نیە شەو.
٤. مانەوە لەمینا لەشەوانی تەشریقدا.
٥. فڕەدانی بەردەكان بەڕێكو پێكی.
٦. سەرتاشین یان كورتكردنەوەی.
٧. تەوافیماڵئاوایی (جگە لەو ئافرەتانەی لەحەیز و نیفاسدان).

* هەر كێ بەئەنقەست یەكێك لەو واجباتانە ئەنجام نەدات پێویستە لەسەری قوربانی یەك بدات و حەجەكەی تەواوە.

## سوننەتەكانی حەج

جگە لەمانەی كەپێشتر باسمان كرد و جێگیر بوونە لەپێغەمبەر (ﷺ) سوننەتە، هەركێ ئەنجامیان بدات كارێكی چاكی كردووە و، ئەوەشی نەیكات گوناهبار نابێت.

* الافاضة: واتە: بەلێشاو

# کارەکانی میقات

## کاتێك دەگەیتە شوێنی دیاریکراو ( میقات )



١. خۆت دەشویت

٢. ئینجا خۆت بۆن خۆش دەکەیت

٣. ئیحرام لەبەر دەکەیت (ئافرەت لەجلی پۆشتەدا ئیحرام دەکات و نابێت نیقاب و پەچە و دەست کێش بەکار بهێنێ).

٤. ئینجا لەدڵتەوە نیەت دەهێنیت و، دەڵێیت: (اللهم لبيك عمرة) لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك.

# لەکاتی ڕۆیشتن بەرەو مەککە

## پێویستە بەزۆری تەلبیە بکەیت، واتە بڵێیت:

لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك
لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك



# گەیشتن بەمەککە و چوونە ناو مزگەوتی حەرامەوە



١. خۆت بشۆ ئەگەر توانیت.



٢. کاتێك دەچیتە(المسجد الحرام)ەوە، بەپێی ڕاستت دەچیتە ناو مزگەوتەوەو. دەڵێیت: بسم لله و الصلاة و السلام على رسول الله. أعوذ بالله العظيم و بوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم، اللهم افتح لي ابواب رحمتك.



٣. کاتێك دەگەیتە کەعبە و پێش دەست پێکردنی تەواف واز لەتەلبیە کردن دەهێنیت.



٤. لە کاتی (طواف)دا، (إضطباع) دەکەیت، واتە: ناوەڕاستی ئیحرامەکە دەخەیتە ژێر باڵی ڕاستت و، هەردوو سەرەکەی دەخەیتە سەرشانی چەپت.

# دەست پێوەدانی بەردە ڕەشەکە





ئینجا دەست دەدەیتە بەردە ڕەشەکەوە بەدەستی ڕاستت و ماچی دەکەیت و، دەڵێیت: بسم الله والله أكبر

یان دەستی بۆ درێژ دەکەیت و، دەڵێیت: بسم الله والله أكبر.



هەموو جارێکیش بەتەنیشتی بەردەکەدا تێپەریت لە جارەکانی تر دەستی پێوە بدە و ماچی بکە، یان ئاماژەی بۆ بکە و بڵێ: الله أكبر.

# تـــەواف كـــردن

**حەوت جار تەواف دەكەیت لە( الحجر الاسود ) ەوە دەست پێ دەكەیت و هەر لەوێیش تەواو دەبێت.**



١. لە سێ جاری یەكەمدا لەتەوافەكەت بەپەلە رێدەكەیت و، هەنگاوەكانت نزیك یەكتر بن.



٢. لەجارەكانی تر ئاسایی رێ دەكەیت و، یادی خوا دەكەیت و دەپارێیتەوە و، قورئان دەخوێنی.



٣. دەست دەدەیتە گۆشەی یەمانی یەوە بەدەستی راست و، دەڵێیت: بسم الله والله أكبر.



٤. لەنێوان (الحجر الاسود) و (الركن اليمانى) دەڵێیت: (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار)

# مەقامی ئیبراهیم



١. کاتێك لەتەواف دەبیتەوە بڕۆ لای مەقام و بڵێ (واتخذوا من مقام ابراهیم مصلی)



٢. ئینجا لەپشتی مەقامەوە دوو رکات نوێژ دەکەیت ئەگەر توانیت، ئەگەر نا لەهەر جێگایەکی مزگەوتی حەرام دەتوانیت نوێژ بکەیت و، لە ڕکاتی یەکەمدا سوڕەتی (قل یاأیها الکافرون) دەخوێنی، لەڕکاتی دووەم یشدا سوڕەتی (قل هو اللّٰه أحد) دەخوێنی، لەپاش سوڕەتی (الفاتحة)



پاش ئەوە دەگەڕێیتەوە لای (الحجر الاسود) و دەستی پێوە دەدەیت.

# سەعی نێوان صەفاو مەڕوە



ئینجا دەچیتە سەر صەفا
١. کەنزیك دەبیتەوە لەصەفا ئەم ئایەتە بخوێنە (ان الصفا و المروة من شعائر الله فمن حج البيت او اعتمر فلا جناح عليه انه يطوف بها ومن تطوع خيرا فان الله شاكر عليم).
ئینجا بڵێ: (نبدأ بما بدأ الله به) واتە: بەوە دەست پێ دەکەین کە خوای گەورە دەستی پێکردووە.



٢. ئینجا دەچیتە سەر صەفا و، ڕوو دەکەیتە قیبلە و، دەڵێیت: الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شئ قدير، لا إله الا الله انجز وعده ونصر عبده وهزم الاحزاب وحده.
ئینجا دەپاڕێتەوەو ئەو وێردو نزایە سێ جار دووبارە دەکەیتەوە.

# سەعی نێوان صەفاو مەڕوە

٣. ئینجا حەوت جار سەعی دەکەیت، لەصەفا وە بۆ مەڕوە یەك شەوتە، لە مەڕوەشەوە بۆ صەفا شەوتێکی ترە، لەکاتی سەعی کردنیشدا بەزۆری بپاڕێڕەوەو یادی خوا بکە.



پێش گەیشتنی بە دوو نیشانە سەوزەکە ئاسایی ڕێ دەکەیت.

لەنێوان هەردوو نیشانە سەوزەکە بەتوندی ڕێ دەکەیت و ئەمەیش تایبەت بەپیاوانەوەو، هەموو جارێکیش هەروا دەکەیت.

لەپاش دوو نیشانە سەوزەکە ئاسایی ڕێ دەکەیت.



٤. ئینجا سەردەکەویتە سەر مەروەو، بەرانبەر قیبلە دەبیتەوەو، دەڵێیت: الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، لا إله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شئ قدير، لا إله الا الله انجز وعده ونصر عبده وهزم الاحزاب وحده.

ئینجا دەپاڕێتەوەو ئەو وێردو نزایە سێ جار دووبارە دەکەیتەوە.

# کردنەوەی ئیحرامی عومرە



ئینجا پیاو سەری دەتاشێت



یان کورتی دەکاتەوە
لەهەموو لایەکی قژیەوە

سەرتاشین باشترە، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت کە کاتی حەج نزیك بووبێتەوە، ئەو کاتە کورتکردنەوە چاکترە.



ئافرەت بەئەندازەی
سەر پەنجەیەك لەهەموو
پەلکێکی دەگرێت



بەم شێوەیش عومرەکەت تەواو بووە و،
ئەوەی قەدەغە بوو لەسەرت بە هۆی
ئیحرامەوە ڕەوا دەبێتەوە بۆت.

# ڕۆژی تەرویە [ڕۆژی هەشتەم]



١. خۆت دەشۆیت

٢. ئینجا خۆت بۆن
خۆش دەکەیت

٣. ئینجا ئیحرامەکەت
دەپۆشیت.



٤. ئینجا لەدڵتەوە نیەت دەهێنیت و، دەڵێیت:

لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك،
ان الحمد والنعمة لك و الملك لا شريك لك.

**ئەم وێردە زۆر دوبارە دەکەیتەوەو
بەرەو مینا دەچیت.**

# گەیشتن بەمینا (ڕۆژی هەشتەم)

بەرەو مینا دەچیت و بەزۆری تەلبیە دەکەیت و لەڕۆژی تەرویە*



نوێژی نیوەڕۆ دەکەیت لەکاتی خۆی لەمینا.



نوێژی عەسریش دوو ڕکات لەکاتی خۆیدا دەکەیت لەمینا.



نوێژی مەغریب لەشەوی نویەم ئەنجام دەدەیت لەمینا سێ ڕکات لەکاتی خۆی.



نوێژی عیشا لەشەوی نۆیەم ئەنجام دەدەیت لەمینا دوو ڕکات لەکاتی خۆی



نوێژی بەیانی لەڕۆژی نۆیەم ئەنجام دەدەیت لەمینا دوو ڕکات لەکاتی خۆی.

* واتە: ڕۆژی هەشتەم، ڕۆژی پێش عەرەفە.

# ڕۆیشتن بەرەو عەرەفە (ڕۆژی نۆیەم)

١. لەپاش خۆرهەڵاتنی ڕۆژی نۆیەم بەدەم تەلبیەوە دەکەویتە ڕێ بەرەو عەرەفە.




٢. ئینجا نوێژی نیوەڕۆ و عەصر بەقەصر و جەمع دەکەیت لەعەرەفە لە کاتی نیوەڕۆدا بەیەك بانگ و دوو ئیقامە.



**ڕاست ڕاوەستان تاکو خۆرئاوا بۆ کەسێك بەڕۆژ لەعەرەفە ڕاوەستا بێت واجبە.**



لەڕۆژی عەرەفە بەزۆری خەریکی وێردو پارانەوە دەبیت لە خوای گەورە و، ڕوودەکەیتە قیبلە تاکو خۆرئاوا.

باشتر وایە بەزۆری بڵێی:
لا إله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شئ قدير.

ئینجا لەپاش ئاوا بوونی خۆری ڕۆژی عەرەفە بەهێمنی و لەسەر خۆیی بەڕێ دەکەویت بەرەو موزدەلیفە



# گەیشتن بە موزدەلیفە (ڕۆژی نۆیەم)



١. نوێژی مەغریب دەکەیت سێ ڕکات و عیشا دوو ڕکات بەیەك بانگ و دوو ئیقامەت.



٢. شەوی جەژن لەوێ دەمێنێتەوەو، بۆ کەسانی لاواز و پەککەوتوو دەتوانن لەکۆتایی شەوەوە لەوێ بەڕێ بکەون.



٣. ئینجا نوێژی بەیانی دەکەیت و لە سەرەتای کاتەکەیدا بەیەك بانگ و ئیقامەتێك.



٤. ئینجا یادی خوا دەکەیت و مەزن ڕایدەگریت و لێی دەپاڕێیتەوەو، ڕوو دەکەیتە قیبلە لە (المشعر الحرام) ئەگەر بۆت کرا، ئەگەر نا لە هەر جێگایەکی تر لەموزدەلیفە تاکو ڕۆژ دەبێتەوە.

# (ڕۆژی دەیەم) کارەکانی ڕۆژی قوربانی سەربڕین (اليوم النحر)

١. لەڕۆژی نەحر کاتێك تەواو دونیا ڕووناك دەبێتەوەو، پێش خۆرهەڵاتن بەڕێ دەکوێت بۆ مینا.




٢. ئینجا بەرد فڕێ دەدەیتە جەمرەی عەقەبە لەپاش خۆرهەڵاتن و واز لەتەلبیە کردن دەهێنی.




٣. ئینجا قوربانی یەکەت سەر دەبڕیت و، دەڵێیت: بسم الله الله أكبر اللهم هذا منك ولك ، اللهم تقبل مني.



٤. ئینجا پیاو سەری دەتاشێت یان کورتی دەکاتەوەو تاشینیشی چاکترە



ئافرەتیش ئەوەندەی سەرە پەنجەیەك لەقژی کورت دەکاتەوە وەکو لە عومرە ئەنجامی دا.

# (رۆژی دەیەم) کارەکانی رۆژی قوربانی سەربڕین (الیوم النحر)



٦. ئینجا هەڵدەستی بە ئەنجامدانی (طواف الافاضة) ئەوەی ئەنجامت دا لەتەوافی هاتندا بۆ مەککە لێرەش هەروا دەکەیت جگە لەوەی بەپەلە رێ ناکەیت.



٥. لەپاش فڕەدانی بەردی جەمرەی عەقەبە و سەرتاشین یان کورتکردنەوەی خۆکردنەوەی یەکەم دروست دەبێت و، بەپێی ئەوەش هەموو شتێك بۆ ئەو کەسەی لەئیحرامدایە رەوا دەبێت جگە لەئافرەت، ئینجا خۆت بۆن خۆش دەکەیت پێش تەوافی (الافاضة)



٨. ئینجا سەعی دەکەیت لەنێوان صەفا و مەڕوەو، هەمان ئەو کارانە دەکەیت کە یەکەم جار کردت.



٧. ئینجا لەئاوی زەمزەم دەخۆیتەوە

**بەم شێوە خۆکردنەوەی دووەم دروست دەبێت و، پاش ئەوە هەموو شتێك کە بەهۆی ئیحرامەوە لێت قەدەغە بوو ڕەوا دەبێت بۆت تەنانەت ئافرەتیش.**

# (رۆژانی تەشریق* ) فڕێدانی بەردەکان و مانەوە لەمینا

روو لە قیبلە

لــەپــاش نـیـوەڕۆی رۆژی یانزەمین (واتە رۆژی یەکـەم لە رۆژانی تەشریق) هەروەها لەڕۆژی دوانزەمین (دووەم رۆژی تەشریق) و لەرۆژی سیانزەمین (سێ یەم ڕۆژی تەشریق) بەردەکانی تر فڕێ دەدەیت رۆژی سیانزەمین بۆ کـەسێکـە دواکـەوتبێت.





ئینجا بە حەوت بـەرد رەجمی جەمرەی عەقەبە دەکـەیت و دەرۆیت و راناوەستیت لـەلایدا

٥



٤

ئینجا روو دەکـەیت قیبلەو زۆر دەپاڕێیتەوە.





ئینجا بەحەوت بەرد رەجمی جەمرەی دووەم دەکەیت لەگەڵ هەموو بەردێکدا دەڵێی: الله أكبر.

٣

٢

بەجەمرەی یەکەم دەست پێ دەکەیت کە لە پاش مزگەوتی خەیفەوە دێت حەوت بەرد دەهاوێژی لەگەڵ هەموو بەردێکدا دەڵێیت: الله أكبر.

١









* ڕۆژانی تەشریق مەبەست لەسێ ڕۆژی دوای جەژنە

# تەوافی ماڵ ئاوایی



ئینجا تەوافی مـاڵ ئاوای
ئەنجـام دەدەیت کـاتێك
دەتـەوێت لەمەککە دەربچیت
وەکـو ( طـواف الافـاضة )
ئەنجامی دەدەیت.

## ئەو هەڵانەی هەندێك لەحاجیان تێی دەكەون

١. لەپاش ئیحرام پۆشین: لابردنی موو و، نینۆك گرتن و، خۆ بۆن خۆشكردن وچوونە لای خێزان و...، راو كردن و، پۆشینی نیقاب و دەست كێش بۆ ئافرەتان و، پۆشینی جلی دوراو بۆ پیاوان و، داپۆشینی سەر بۆ پیاوان و، دانانی نەعلێكی تایبەت بە ئیحرام و، شان ئاشكرا كردن جگە لە كاتی تەوافكردن.

٢. رۆیشتن بۆ ئەو مزگەوتانەی كە لە مەككە و دەورو بەریدان (جگە لە المسجد الحرام) و، ئەو شوێنانەی لەدەوری مەكەن.

٣. نوێژ كردنی (تحية المسجد) لەلایەن كەسێك لەئیحرامدا بێت و، دەست بەرز كردنەوە لە كاتی دەست پێوەدانی (الحجر الاسود) و، ماچ كردنی گۆشەكانی تر جگە لە (الحجر الاسود) و، دەست و دەم و چاو هێنان بە دیوارەكانی كەعبە و، بەمەقامدا و، بەپیرۆز تەماشا كردنی ئەو بارانەی لە كەعبە دێتە خوارەوەو، تایبەت كردنی هەندێ دوعای دیاریكراو بۆ تەواف جگە لە (ربنا آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار).

٤. نیەت هێنان بەزمان بۆ ئەو خراپەرستنانە.

٥. سەعی كردن چواردە جار و، دوو ركات نوێژ لەپاش سەعی كردن.

٦. نەمانەوە لە مینا لە رۆژی هەشتەم و، ڕۆیشتن بۆ عەرەفە لە شەوی نۆیەمی (ذي الحجة) و، ڕاوەستان لە دەرەوەی سنووری عەرەفە و، بێ دەنگی یان خەریك بوون بەگاڵتە و گەپ لەعەرەفات یان خەوتن و، یان رۆیشتن بۆ سەرەوەی كێوی عەرەفات و، وێنە گرتن بۆ یادگاری و، ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ و عەصر پێش وتارەكە و، نوێژی سوننەت كردن لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ و عەصر دا لە عەرەفە و، گەڕانەوە پێش مەغریب.

٧. ورد نەبوونەوە لـەوەی ڕووبکرێتە قیبلە لـەکاتی نوێژ کردن لـە موزدەلیفە و، بەپەلـە نەڕۆیشتن بـۆ نوێژی مەغریب دەست بەجێ پـاش گەیشتن بەموزدەلیفە و، خۆ خەریك کردن بە بەرد هەڵگرتن و، ئەنجامدانی نوێژی بەیانی پێش کاتی خۆی.

٨. شۆردنی بەردەکان پێش هاویشتنیان و، یـان بەکار هێنانی پێلاو و شتی تر و، یان بەرد فڕەدانی جەمرەی عەقەبە لەپشتی یەوە، بەشێوەیەك بەردەکان نەکەونە ناو حەوزەکە.

٩. وردنەبوونەوە لەمەرجەکانی ئەو قوربانی یەی سەر دەبڕدرێت و، سەر بڕینی قوربانی لەدەرەوەی مەککە و، یان سەربڕین لەپێش ڕۆژی کوشتار یان پاش ڕۆژانی تەشریق و، ڕیش تاشین و، دەست پێکردن بەتاشینی سەر لەلای چەپەوە.

١٠. بەرد فڕێدان پێش نیوەڕۆ، یان بەپێچەوانەوە واتە دەست پێکردن بەگـەورەکـە و، پەرۆشبوون بۆ پێکانی پەیکەرەکە لـەناو حـەوزەکە و، فڕەدانی هەموو بەردەکان بە...

**تەواو بوو سوپاس بۆ خوا**

## چەند پرسیارکی گرنگ و وەلامەکانیان لەلایەن شێخ (عبد العزیز بن باز) کە موفتی پێشووی ولاتی سعودیە بوو

پرسیار: پیاوێك لەشەوی جەژندا چووە لای خێزانەکەی پاش دابەزین لە عەرەفە بەرەو موزدەلیفە لەپێش ئیحرام کردنەوەی یەکەم؟

وەلام: ئەو کەسە پێویستە لەسەری وشترێك سەربرێت کە بشێت بۆ قوربانی، خێزانەکەشی ئەگەر ڕەزامەند بووبێت ،لەسەر ئەو کارە هەمان ئەو کەفارەتەی دەکەوێتە سەر ، پێویستە ئەو دوو وشترە لە حەرەمدا سەربرێن و دابەشکرێنە سەر هەژارانی مەککە، ئەگەر تواناى ئەوەیان نەبوو پێویستە لەسەریان هەریەکەیان دە ڕۆژ بەڕۆژوو بن و، ساڵی داهاتوو حەجەکەیان بگێڕنەوە، ئیحرام دەکەن لەهەمان شوێنەوە کە ئیحرامیان لێیەوە کردبوو یەکەم جار، هەروەها پێویستە لەسەریان تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەن لەو تاوانەیان.

کەسێك لەناو حیجری (إسماعیل)ەوە تەوافی کرد و سەعی کرد و ئینجا ئیحرامی کردەوە پاشان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ و چووەلای هاوسەرەکەی، ئایا گوناهبار دەبێت؟

وەڵام: ئەو عومرەیە پووچەڵ بووەتەوە چونکە تەوافەکەی ناتەواوە و، پێویستە دووبارەی بکاتەوە، هەروەها سەعی بکات و قژی کورت بکاتەوە و پێویستە مەڕێك سەرببڕێت لە مەککە لەبری چوونەلای هاوسەرەکەی پێش ئەوەی عومرەکەی تەواو بکات، چونکە تەواف کردنی لەناو حیجری (إسماعیل)ەوە تەواو نیە ، بەڵکو پێویستە لە پشتی حیجرەوە تەواف بکات، پێویستە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ میقات و ئیحرام بکاتەوە.

پرسیار: ئەگەر حاجی لەدەرەوەی سنووری عەرەفە ڕاوەستا تاکو خۆر ئاوابوون و پاشان گەڕایەوە حوکمی حەجەکەی چیە؟

وەڵام: ئەگەر حاجی لەسنووری عەرەفە ڕانەوەستا لە کاتی ڕاوەستاندا حەجی نەکردووە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( الحج عرفه)، هەرکەسێکیش بەشەو بگاتە عەرەفە پێش بەرەبەیان حەجەکەی درووستە، کاتی ڕاوەستانیش لە دوای کاتی (زوال) لەنیوەڕۆ دەست پێدەکات تاکو سپێدەی ڕۆژی جەژن، ئەمە یەکدەنگی زانایانی لەسەرە ، بەڵام لەپێش زەوال جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا لەو بارەوە، زۆربەشیان لەسەر ئەوەن ئەگەر لەپاش کاتی نیوەڕۆ لەعەرەفە ڕانەوەستابێت و، لەشەویش ڕانەوەستابێت حەجەکەی درووست نیە، بۆیە هەرکێ لەنێوان نیوەڕۆ و سپێدەی ڕۆژی دواتر دا ڕاوەستێت حەجەکەی تەواوە ، باشتریشە بەڕۆژ ڕاوەستێت لەپاش ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ و عەصر بە کۆکردنەوەی پێشخستن ( جمع تقدیم) تاکو خۆرئاوا، درووستیش نیە پێش خۆرئاوابوون عەرەفە

بەجێبهێڵێت، ئەگەر کەسێك وایکرد بەلای زۆربەی زانایانەوە سەربڕینێکی لەسەرە، چونکە وازی لە واجبێك هێناوە ئەویش ڕاوەستانە لە عەرەفە.

پرسیار: ئایا درووستە حاجی تەنها تێپەڕێت بەلای موزدەلیفە، بێئەوەی تاکو نیوەشەو تێیدا بمێنێتەوە؟

وەڵام: مانەوە لە موزدەلیفە یەکێکە لە واجباتی حەج، بۆیە ئەگەر حاجی ئەو کارەی ئەنجان نەدا پێویستە مەڕێك بۆ هەژارانی حەرەم سەربېرێت، بەڵام ئەکەر حاجی بەلای موزدەلیفەدا تێپەڕی و تێیدا نەمایەوە، بەڵام جارێکی تر گەڕایەوە بۆ موزدەلیفە پێش نوێژی بەیانی ئەگەر بۆماوەیەکی کەمیش بێت تێیدا بمێنێتەوە لەوحاڵەتەدا فیدیەی ناکەوێتە سەر.

پرسیار: تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو لەگەڵ باوکمدا حەجم کرد، بەڵام هیچم دەربارەی حەج نەدەزانی، لەجێگەی ڕەجمکردنی شەیتان باوکم لەجیاتی من حەوت بەردەکەی بەیەکجار فڕێدا، ئایا حەجەکەم تەواوە؟ وەڵامم بدەنەوە ڕەحمەتی خواتان لێبێت.

وەڵام: ئەگەر باوکت هەر حەوت بەردەکەی پێکەوە فڕێدابێت، سەربڕینێکت لەسەرە، حەوت یەکی وشترێك یان حەوت یەکی مانگایەك یان مەڕێك یان بزنێك لە مەککە سەربڕدرێت و دابەشکرێتە سەر هەژارانی حەرەم، چونکە ڕەجم کردنی شەیتان یەکێکە لە واجبەکانی حەج ئەگەر حاجی هەمووی بەجارێك فڕێدات وەکو ئەوەیە یەك بەردی فڕێدابێت، حەجەکەت دروستە و پێویست ناکات دووبارەی بکەیتەوە، بەڵام کەم و کوورِیەکی تێدا بووە بەوشێوە چارەسەردەبێت کەپێم وتی، ئەو کەسانەش کەناتوانن بەردەکان فڕێدەن، وەکو بێتوانا و نەخۆش و پیر و ئافرەت، دەتوانن کەسێك بکەنە بریکاری خۆیان بەردەکەیان بۆ

فرێدات، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی(فاتقوا الله ماستطعتم)

پرسیار: حوکمی ئەو حاجیە چییە سێ ڕۆژەکە، یان دوو ڕۆژەکە بۆ ئەوانەی کە پەلەیانە لە مینا نامێنێتەوە، ئایا پێویستە بۆ هەموو ڕۆژێك مەڕێك سەربڕێت، یان یەك مەڕ بەسە بۆ هەر سێ ڕۆژەکە؟

وەلاّم: هەرکێ بەبێ پاساو و هۆکار واز لەمانەوە بهێنێت لە مینا لەو ڕۆژانەی کە پێیان دەوترێت (أيام التشريق) ئەوە وازی لە واجبێك هێناوە پێویستە سەربڕینێك ئەنجام بدات لەجیاتی هەر سێ ڕۆژەکە.

پرسیار: ئیحرامم کرد بەو شێوەی کە پێویستە لەسەرم سەربڕین ئەنجام بدەم، بەلاّم هەموو پارەکانم ون کرد لەو کاتەدا، ئایا حوکمی ئەو حاڵەتەی من چیە؟ هاوسەرەکەشم لەگەڵدایە.

وەلاّم: ئەگەر کەسێك ئیحرامی عومرەی کرد وەکو (تمتع) تاکو کاتی حەج، یان ئیحرامی بەست بە حەج و عومرە پێکەوە (قران)، لەو حاڵەتەدا پێویستە لەسەری مەڕێك یان بزنێك یان حەوت یەکی وشترێك یان حەوت یەکی مانگایەك لە ڕۆژانی (النحر) دا بکات بە فیدیە و

دابەشیکاتە سەر هەژاران و خۆیشی لێی بخوات، ئەگەر توانای ئەوەی نەبوو وەکو ئەم حاڵەتەی تۆ، یان لەبەر هەژاری لەو حاڵەتە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت و حەوت ڕۆژیش لەکاتی گەڕانەوەی ، دەشتوانێت یانزە و دوانزە و سیانزە بەڕۆژوو بێت ئەگەر ئەو سێ ڕۆژەش لە پێش ڕۆژی عەرەفە بیگرێت چاکترە ئەگەر پارەکانی زووتر ون بووبێت، حەوت ڕۆژەکەش لەکاتی گەڕانەوەی دەیگرێت .

پرسیار: حوکمی چیە کەسێك تەوافی ماڵئاوایی نەکات؟

وەڵام: حەجەکەی دروستە، چونکە ئەو تەوافە واجبە لە پەسەندترین بۆچوونی زانایاندا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:(لا ينفرنّ أحدكم حتى يكون آخر عهده بالبيت ) أخرجه مسلم في صحيحيه. واتە با کۆتا کارتان پێش گەڕانەوەتان تەواف کردن بێت بەدەوری ماڵی خوا، جگە لەو ئافرەتانەی لە (حیض و نفاس)دان، چونکە ئیبنو عەبباس ڕەزای خوایان لێبێت فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی

به خەڵكی دەكرد ئاخرین كاریان لە حەجدا تەواف كردن بێت جگە لەو ئافرەتانەی لە حەیزدان .

پرسیار: لە جەددەوە ئیحرامم كرد بۆ حەج كردن، بەڵام لەپاش دەرچوونم لە عەرەفە ڕاستەوخۆ ڕۆشتم بۆ مینا و لە موزدەلیفە نەمامەوە، جلەكانی ئیحرامم داكەند و بڕیارم دا واز لە حەجەكەم بهێنم و گەڕامەوە و چوومەلای خێزانم و، حوكمی ئەم كارەم چیە ؟

وەلاّم: ئەوە كارێكی نابەجیّ و خراپە و، پێویستە لێی پەشیمان بیتەوە، چونكە هەركەسێك چووەناو حەج و عومرەوە، درووست نیە لێی دەربچێت تاكو تەواوی نەكات مەگەر كەسێك ناچار بێت، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ( وأتموا الحج و العمره لله) حەجەكەیشت بەتالّ بووەتەوە بەهۆی ئەوەی چویتەتە لای هاوسەرەكەت، پێویستیشە لەسەرت وشترێك بكەیت بە فیدیە كە بۆ قوربانی بشێت، یان حەوت مەڕ سەربڕیت بۆ قوربانی بشێن و دابەشیكەیتە سەر هەژارانی مەككە، هەروەها پێویستە

سەربڕاوێك بكەیت بە فیدیە بەهۆی نەمانەوەت لە مینا، یەكێكی تریش بەهۆی فڕێنەدانی بەردەكان، پێویستیشە لەسەرت تەواف و سەعی و سەرتاشین ئەنجام بدەیت، لەو حاڵتەشدا پێویست بە تەوافی ماڵئاوایی ناكات، بەڵام ئەگەر لەپاش تەواف و سەعی كردن لە مەككە مایتەوە، پێویستە تەوافی ماڵئاویش بكەیت لەكاتی گەڕانەوەت بۆ جەددە، پێویستە ساڵی داهاتووش حەجێكی تر بكەیت لەجیاتی ئەو حەجەی كە پووچەڵ بوویەوە، خوای گەورە تەوبەی ڕاستەقینەمان پێببەخشێت و لە ئێمە و هەموو موسوڵمانان خۆشبێت .